# بسم الله الرحمن الرحم

ناوی کتێب : فێربوونی ISO

نووسەری کتێب : دلۆڤان بەختیار محمد کریم

ناونیشان : ســــــلـــێمـــانـــــــی

پەیوەندی کردن : ئەتوانن لە ڕێگەی ئەم دوو ناونیشانە پەیوەندیم پێوە بکەن :

ژمارەی موبایل : 0770 638 5554

ئیمێڵ : dlovan.bakhtiar@hotmail.com

ساڵی بەرهەمهێنانی کتێب : 2012/8/13




دەستپێك :

به ناوی خودای گەورە و بەخشندە و میهرەبان ، سڵاوی خوا لە هەموو لایەك بێت ، بەڕێزان و خۆشەویستان زۆر خۆم بە خۆشحاڵ ئەزانم کە یەکەم کتێبم لە بواری ئایتی بڵاو ئەکەمەوە بە زمانی شیرینی کوردی ، بەڕێزان منیش ویستم کتێبێك بنووسم و روونکردنەوەیەکی بچووك بدەم لەسەر یەکێك لە بەرنامەکانی کۆمپیوتەر ئەویش بەرنامەی ISO یە ڕەنگە زۆربەتان زانیاریتان لەسەر نەبێت ، بەڵام لە دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە زانیاریتان لەسەر ئەو بەرنامەیە دەبێت بە پشتیوانی خوا ، خۆشەویستان ویستم ئەم کتێبە بنووسم بە زمانی شیرینی کوردی بۆ ئەوەی کەلێنێك لە جیهانی تەکنەلۆجیا بە زمانی شیرینی کوردی پڕبکەمەوە ، بەڕێزان لەم کتێبەدا باس لەوە ئەکەم کەوا چۆن بەرنامەی ISO ئیش پێبکەین سەرەتا بزانین ئیشی ئەم بەرنامەیە چیە ؟ ئیشی ئەم بەرنامەیە ئەوەیە کە تۆ ئەتوانی شریتی ویندۆی پێ دروست بکەت واتە تۆ ویندۆیەکت دروست کردووە چۆن بتوانیت ئەو ویندۆیە ئیش پێبکەیت و هەموو کۆمپیوتەرێکی پێ فۆرمات بکەیت وە تا ئێستاش هیچ کتێبێکی لەو شێوەیەم نەبینیوە ، بۆیە منیش ئەم کتێبەم لەسەر دانا ڕەنگە ئەمە کورتەیەکیش بێت لەسەری و سەرەتا بێت بۆتان بەلام " هەر چەند بزانی ئەو کات ئەزانی کە هیچ نازانی " وابزانم زۆربەتان ئەم ووتەیەتان بیستووە و مانای ئەزانن بۆیە ئێستاش فەرموون لەگەڵم بن بۆ فێربوونی بەرنامەی ISO .



بەڕێزان ئەم بەرنامەیە با بزانین سەرەتا بۆ چی بەکاردێت و ئیشەکەی چیە ؟ هەر وەك لە سەرەوە وەڵامێکی کورتم دایەوە بەڵام

لێرەدا وەڵامەکەی بە تەواوی وەردەگریت ، ئەم بەرنامەیە کە ناوی تەواوی بریتیە لە UltraISO وە ئەمەش ئایکۆنی بەرنامەکەیە




وە بۆ زۆر شت بەکاردێت یەکێك لەو ئیشانە بریتیە لەوەی : کەوا تۆ ئەتوانیت ویندۆسێك بە کاملی بخەیتە سەر سیدی و کاری پێبکەیت یان ویندۆسێکی خەیاڵی (فهمی) پێ دروست بکەیت ، وە چەندین ئیشی تر بێگومان ئەگەر خۆت مومارەسەی لەسەر بکەیت ئەوا زیاتر شارەزایت لێ پەیدا دەبێت ، باشە ئێستا ئەم کەمە زانیاریەت زانی با ئێستا بچین یەکەم کارمان ئەنجام بدەین یەکەم کار بریتیە : لە دابەزاندنی بەرنامەکە ئەویش ئەوەیە کەوا تۆ لە Google ناوی بەرنامەکە بنووسیت و یەکسەر بۆت ئەهێنێت ئەمەش سێریاڵی بەرنامەکەیە :

9B66-5DEB-C10E-824A

وە بۆ چۆنیەتی خەزن کردنی پێویست بە ڕوونکردنەوە ناکات وەك هەر بەرنامەیەکی ئاسایی تر ئەتوانیت خەزنی بکەیت و پاشان سێریاڵەکەی داخل بکە کە من لەسەرەوە بۆم داناویت ، دوای ئەوەی کەوا خەزنت کرد ئێستا باس لەوە ئەکەم کەوا ئێمە چۆن بتوانین سوود لەو بەرنامەیە وەربگرین و بتوانین کە ویندۆسێك لە ئەنتەرنێتەوە داتبەزاندووە یان ئەوەتا لە شوێنێکی ترەوە هێناوتە چۆن بیخەینە سەر سیدی بۆ ئەو مەبەستە فەرموون ......

- چۆنیەتی خستنی ویندۆیەك بۆ سەر سیدی

بەڕێزان تۆ ئەتوانی بەم بەرنامەیە هەموو جۆرە ویندۆیەك وەربگریت واتە XP یان 7 یان vista یان هەر جۆرێکی تر لە جۆرەکان ، ئەو پێداویستیەی کە زۆر پێویستە ئەوەیە تۆ سیدیەکی ویندۆست هەبێت جا هەر ویندۆسێك بێت گرنگ نیە چونکە ئیشمان پێیەتی و دواتریش ئەزانی ئیشەکە چیە ، پاشان تۆ ئەو بەرنامەیە لەسەر XP یان 7 یان 8 بەکارئەهێنیت هیچ کێشەیەکی نیە و ئیشمان بەوە نیە ، سەرەتا سیدی ویندۆسەکە بکەرە ناو سیدی روومەکەت و پاشان بەرنامەکە بکەرەوە ئەمە وێنەی رووکاری بەرنامەکەیە :




پاشان وەك من برۆ سەر بەشی Tools




پاشان کرتە لەسەر Make CD/DVD Image بکە یان ئەتوانی
هەر دەست بە دووگمەی F8 دا بنێیت و پاشان ئەم بۆکسە ئەبینیت




پاشان ئیستا پێت ئەڵێت کە سیدیەکەی تێدایە و پاشان لەو بەشەی کە
نووسراوە Output File Name ئەوە پێت ئەڵێت ئەو فایلەت لە
کوێ خەزن ئەکەیت تۆ ئەوە بە ئارەزووی خۆتە کوێ
هەڵئەبژێریت ، پاشان ئەو بەشەی کە نووسراوە Output

Format لەوێدا تۆ چەند بەشێکت هەیە تۆ ئەتەوێت بە کامە بەش خەزنی بکەیت ئەوەت لێ ئەپرسێت . بێگومان ئێمەش یەکەم هەلبژاردە هەلئەبژێرین کە نووسراوە Standard ISO چونکە ئێمە خۆمان بەو بەرنامەیە ئیش ئەکەین پاشان کلیك لەسەر Make بکە کە کرتەت کرد شێوەیەك لەم بۆکسە ئەبینیت




ئێستا لێرەدا هەڵئەستێت بە خەزن کردنی ویندۆیەکەت بە شێوەی فایلی ISO بۆ ناو کۆمپیوتەرەکەت وازی لێبهێنە هەتا تەواو ئەبێت و ئیشەکەت لە 100% سەر ئەگرێت . لێرەدا هاتینە کۆتایی ئەم وانەیە بە هیوام سوودی لێببینن .



- بەڕێزان لەم وانەیەدا باس لەوە ئەکەم کەوا چۆن بتوانین بە بەرنامەی Ultra ISO درایڤ زیاد بکەین بۆ کۆمپیوتەرەکەمان واتە بۆ نموونە : تۆ درایڤت هەیە و ئەتەوێت بیکەیتە 4 درایڤ چۆن ئەو کارە بکەین ؟ ئەویش ئێمە ئەتوانین بە بەرنامەی Ultra ISO بیکەین فەرموون .....

بۆ نموونە بڕێزان من دوو درایڤی سیدیم هەیە وەك ئەم وێنەیە




ئەو درایڤەی کە کلیکەکەم لەسەر داناوە ئەوە درایڤی ISO یە واتە بە هۆی بەرنامەی ISO زیاد بووە ئەوەی تریش هی کۆمپیوتەرەکەی خۆمانە ئێستا باس لەوە ئەکەین کەوا چۆن بتواین سیدی لەسەر دراڤی ISO ئیش پێ بکەین بۆ نموونە : من لەسەرەوە ویندۆسەکەم خستە سەر سیدی ئێستا چۆن وای لێبکەین بیخوێنێتەوە لەسەر ئەو درایڤە فەرموون ....

سەرەتا وەك من کلیکی لای ڕاست لەسەر درایڤەکە بکە و پاشان Ultra ISO بکەرەوە و پاشان Mount وەك ئەم وێنەیە :




پاشان ئەبینیت کە بۆکسێکی لەم شێوەیەت بۆ ئەکرێتەوە بۆ ئەوەی فایلە ISO یەکەت بهێنیت




ئیستا ئەو شتەی کە ئەتەوێت بیهێنیتە ناو سیدیەکە ئەوا هەڵبیژێرە و پاشان کرتە لەسەر Open بکە یەکسەر ویندۆسەکە ئەچێتە ناو سیدیەکە ، ئیستا ئەگەر بمانەوێت ویندۆسەکە لە ناو سیدیەکە دەربهێنین ئەوا بە هەمان شێوەیە کلیکی لای ڕاست لەسەر درایڤەکە ئەکەین




پاشان Eject هەڵبژێرە کارەکە سەرکەوتوو ئەبێت .

- زیاد کردنی درایڤێکی خەیاڵی

بەڕێزان زۆر جار پرسیارمان لێئەکرێت کەوا ئەتوانین بە هۆی بەرنامەی ISO دراڤی خەیاڵی زیاد بکەین ؟ منیش ئەڵێم بەڵی ! باشە چۆن ئەوە بکەین فەرموو لەگەڵم بە .......

دوای ئەوەی بەرنامەکەت کردەوە ئەوا بچۆ سەر بەشی Option پاشان Configuration وەك ئەمە :




پاشان ئەم بۆكسە ئەبينيت ، تۆ بچۆره سەر بەشی virtual Drive وەك ئەم وێنەيە :




تۆ لە بەشی Number Of Device دا ئەتوانی ژمارەی درايڤەكان زياد بكەيت هەتا 8 درايڤ و پاشان OK دابگره دروست ئەبێت وەك ئەمە




ئێستا ئەگەر تۆ My Computer بکەیتەوە ئەوا ئەبینیت کەوا 8
درایڤی خەیاڵی لە ناو کۆمپیوتەرەکەدا دروست بووە بەم شێوەیە




مەڵی ئەوە 9 دانەیە چونکە ئێمە ووتمان دانەیەکی
کۆمپیوتەرەکە هی خۆیەتی بۆ درایڤێکی کۆمپیوتەرەکە خۆی
لەگەڵ زیادکردنی 8 درایڤ ئەوا ئەبێتە 9 درایڤی خەیاڵی .

بەڕێزان بەم جۆرە هاتینە کۆتایی ئەم کتێبە بە هیوام سوودێکی
بچووکی گەیاندبێ بە هەموو لایەك و بە تایبەت کەسانی
ئارەزوومەندی ئایتی ، هەتا کتێبێکی ترو وانەیەکی تری
بەرنامەی ISO خواتان لەگەڵ .

